بەشی

# ٢

زنجیرە وتاری

# (عەلمانیـەت و داگیرکاری)

وتاری مامۆستا

فواد هەرتەلی

نوسینەوەی

پێگەی نهاوند




عەلمانیەت و داگیرکاری



**لە وتارەکانی**

**بانگخواز مامۆستا فواد هەرتەلی** الله تعالی لێی ڕازی بێت

**بەشی ٢**

**بەناو نیشانی**

**عەلمانیەت و داگیرکاری**

**ئامادەکردن و نوسینەوەی**

**پێگەی نهاوند**



بەڕێزان و خۆشەویستان لە بەشی دووەمی عەلمانیەتدا ئەمێنینەوە ، لە بابەتی ڕابردو ئاماژەمان بەوەدا کە عەلمانیەت بەشی زۆری سەرزەوی گرتۆتەوە . بۆیە ئەگەر سەیری ئامارەکان بکەین ئەبینین دانیشتوانی سەر ئەمڕۆی زەوی زیاتر لە حەوت ملیار کەسە لەو ژمارەیە دەوترێت لەسەدا نەوەدو سێی دیندارە و باوەڕی بە بوونی خوا گەورەهەیە ، وە لەسەدا حەوتی بێدینەو باوەڕی بە بوونی خوا نیە . بەڵام ئەم سەدا نەوەد و سێیە کاتێك دینی عەلمانی کەئێستا چۆتە ناو زۆربەی دەوڵەتەکانەوە وردەوردە دینە ڕەسەنەکەی خۆیان لێ سەندراوەتەوە وچونەتە سەر دینی عەلمانی . بۆنموونە ئەگەر سەیری ئەوروپاو ئەمریکا بکەین کە عەلمانیەت لەوێ سەری هەڵداوە دەبینین مەسیحیەت هەر نەماوە و بە تەواوەتی کاڵ بۆتەوە ، ئەگەر مابێتەوەش هەر لەو ملوانکەیەی ملیان خۆی ئەبینێتەوە کە سەڵیبێکی پێوەیە ئەوە بۆتە عیبادەت و کارو کردەوەو دینداریان ئەمەش بەو مانایەیی من هێشتا دیندارم . ئەمە عەلمانی ئەم دینەی والێکردوە کە بەتەواوی پوکاندویەتیەوە . لەدوای ئەو دووسەد و بیست ساڵەی کە عەلمانیەت لە ئەوروپا سەری هەڵدا لەدوای شۆڕشی فەڕەنسا ئیتر لەو سەد ساڵەی ڕابردوش ڕویان لە وڵاتانی ئیسلامی کرد بۆئەوەی وەك چۆن لە ئەوروپادا لەدوای سەرهەلدانی عەلمانیەتدا دوو جەنگی گەورەی بەخۆوەبینی ئەوانیش جەنگی جیهانی یەکەم ودوەم بو کەبوەهۆی کاولکردن وویرانکردنی بەشێکی زۆری ڕۆژئاواوەوجگەلە کێشەئابوری وئەخلاقی وسیاسیانەی کەوتە نێوان ئەو وڵاتانەی رۆژئاوا کە هەمووی لەدوای عەلمانیەت ڕوی دا وەهۆکارەکەشی بەعەلمانیەتیبون بوو نەك دینداری . جا لەدوای ئەوەی خەلکەکەیان بەتەواوی لەمەسیحیەت داماڵی وخەلکەکەیان هێنایە سەردینی عەلمانی وهیچ بەهایەکیان بۆ مەسیحیەت وکەنیسە نەهێشتەوەوعەلمانیەت بەتەواوی ڕەگی خۆی داکوتی لەڕۆژئاوادا ئینجاعەلمانیەت ڕوی کردە وڵاتانی ئیسلامی لەدوای ڕوخاندنی خەلافەتی عوسمانی لە ساڵی ١٩٢٤ کە لەوە بەدواوە شەریعەتی ئیسلام بەتەواوی ئیلغاکرایەوە و کرایە سوچی ژورەکانەوە و لە پەرلەمانەکان و پەروەردەکان و بەڕێوەبردنی وڵات کاری پێنەکرا و بەتەواوی عەلمانی زاڵکرابەسەرشەریعەتی پیرۆزی ئیسلامدا . جا بۆئەوەی باش لە عەلمانیەت تێبگەین پێویستە شیبکەینەوە نەوەکو

ئێمەش لەسەرئەودینەبین وبەخۆشمان نەزانین وبەکافری بچینەوەبەردەم پەروەردگاروپەنجەی پەشیمانی بگەزین ودادیشمان نادات گەرهەمودەستی خۆشمان بگەزین نەک گەرپەنجەیەکمان بۆیە با وانەزانین کە عەلمانیەت یەك بەشە یان وابزانین کە تەنها شیوعی بێدین و کافرن ، بەڵێ لەلای هەموو کەسێکی نەخوێندەوارو ناشارەزا ئاشکرایە کە کۆمۆنیست باوەڕی بە خوا نیە و ڕەتی دین ئەکاتەوە بە گشتی . ئەمە بەشی یەکەمی عەلمانیەتە کە بە تەواوی ڕەتی خواو هەموو شەریعەتەکان ئەکاتەوە و کافرن ، وە جۆری دووەم ئەو عەلمانیەتە یە کە باوەڕی بە بوونی خوا هەیە بەڵام باوەڕی بە شەریعەتی پیرۆزی ئیسلام نیە وەکو حەلال وحەرامەکان !!ئەمەش ئەو دینەیە کە باسی ئەکەین و بەشی هەرە زۆری موسڵمانانی ئەمڕۆ لەسەرئەوبەشەیەنە یان باوەڕی پێی هەیە بەڵام لە نەزانی خۆی لە حیزبێك کار ئەکات کە دوژمنایەتی شەریعەتی خوا ئەکات بەڵام وا چەواشەکراوە کە نازانێت ئەو بەرنامەیەی لەسەریەتی پێچەوانەی دینەکەیەتی بەڵێ دژی بوونی خوا نیە بەڵام دژی شەریعەتەکەیەتی کە ئەمەش بە هەمان شێوە کوفرە بەڵام ئەم جۆرە کوفرەزۆر شاراوەیە و کەسانی نەفام و ناشارەزا ئاگایان لێنیە کە ئەم جۆرەش ئیلحادی وبێ باوەریەوبە هەمان شێوەی یەکەم کوفرە بەڵام ئەم جۆرەیان شاراوەیە و دیارنیە بۆیە ئەوەی یەکەم زۆر مەترسی دارنیە وەکو هی دووەم چونکە خەڵکی لێی شارەزایە و زەقە کەئەمە کوفرو بێدینیە بەلام ئەوەی دوەم خەڵکی ناشارەزا بێئاگایە لێی و تێناگات بۆیە مەترسی دارترە چونکە ئەوکەسانەی کە هەڵگری ئەم بەرنامەیەن هەندێك وشەی ئاینی بەکاردێنن بۆنموونە ئەلێت بەناوی خوای گەورەو میهرەبان ئنجا دەس بەقسەکانی ئەکات یان ئەلێت من باوەڕم بەخوا هەیە و موسڵمانم وە  شانازی پێوە ئەکەم یان وشەکانی الحمدالله وە إن شاء الله بەکاردێنێت بەڵام دینەکەی عەلمانیەو باوەڕی بەخوا هەیە بەڵام باوەڕی بە شەریعەتەکەی نیە کە مەشروب حەرام بێت و زینا حەرام بێت و ڕیبا حەرام بێت وە بڕینی دەستی دز بەڕەوابزانێت کەئەمانەش یاسای خوای گەورەن بەلام بەراستی نازانێت وکاری پێناکات و باوەڕی پێنیە بەڵکو کار دەکات بۆ هەڵگرتن و کاڵکردنەوەی لەناو خەڵکیش بۆنموونە تەڵاق کەلەناو خەڵك هەیە یان میرات و ئەم بابەتانە ئەیەوێت لەناو مزگەوت دەریبێنێت و بیخاتە ناو

سەبەتەیەك لەبەردەس کەسەکانی خۆی دایبنێت لە مەحکەمە نەك لەبەردەستی کەسانی ئاینی بمینێت ، بۆنموونە ئەگەر سەیری تورکیا بکەین کاتێك مستەفا کەمال ئەتاتورك دەسەلاتی گرتە دەست لە ساڵی ١٩٢٤ هەمو شتێکی مەمنوع کرد لەوانە دینی مەمنوع کرد بانگدانی کردە تورکی زۆرێك لەمزگەوتەکانی داخست کولیە شەریعەکانی داخست و حوجرەکانی داخست و دەرسە دینیو قورئان خوێندنەکانی هەمووی داخست ، لەبان ئەوشەوە نوێژی قەدەغەکرد لە دامو دەزگا حکومیەکان حیجابی قەدەغەکرد وە ڕۆژوگرتنی مەمنوع کرد وە هەر شتێك کە سیمای ئیسلامی پێوە بوایە قەدەغەی ئەکرد سەرەڕای ئەوەش پیتەکانی عەرەبی مەمنوع کرد و کردیە لاتینی بۆیە ئێستا تورکەکان الله اکبر یشیان تەواونیە و زۆر لەفزی عەرەبیشیان تەواو نیە بۆچی چونکە لەو سەد ساڵە جیلێکی بەرهەم هێناوە کە تەواو تەواو لە ئیسلام دوری خستۆتەوە بەڵێ لە سەر ناسنامەکەی نوسراوە موسڵمان بەڵام لەڕاستیدا لەسەر دینە ئەسڵیەکە نەماوە و چۆتە سەر دینی عەلمانیەت . بۆیە ئەوەی ئێستا لە کوردستان ئەگوزەرێت هەر هەمان بەرنامەی ئەتاتورك و زەین عابدینە کەسەرۆکی تونسە کە تەنانەت حیجابی لەناو بازاڕیش قەدەغە کردبوو کەواتە عەلمانیەت دژایەتی شەریعەتی خوا دەکات لەسەر زەوی وەك وتم دژایەتی نوێژ و ڕۆژ و حەج دەکات وەلەبەرامبەر ئەوە چیت بۆ فەراهەم دێنێت بۆنموونە کە ئەو مەشروبی پێ حەرام نیە وڵاتت بۆ پڕ ئەکات لە مەشروب وە ڕێگەئەدات بەبەکارهێنەرانی کە بەئازادی بیخۆنەوە مادام حەزیان لێیە چونکە لە مەشروبداچەندین پارە دەسئەکەوێت وە بۆ ئەویش گرینگ نیە کە میللەت لەناو ئەچێت یان توشی کێشەی دەرونی وخێزانی وکۆمەلایەتی ئەبێت ئەوەی گرینگە دەستکەوتنی پارەیە لەلای ئەو ، یاخود زینا کە ئەبینین مەساج ئەکەنەوە و دیسکۆو ڕەقس دانس ئەکەنەوە و بازاڕی گۆرانی بێژەکان زیاد ئەکەن و یان ئەو فیلمانە ئەخەنە سەر شاشەی تەلەفزیۆنەکان کە بەتەواوی یان نیمچە ڕوتن ئەمە بۆئەوەی تۆ لەگەڵ ئەم ڕوتیە ڕابێیت و مێشکت تەنها بیرێکی سێکسی هەبێت نەك بیرێکی عاقڵ و هۆشمەندت هەبێت . بۆیە دەبینین لە وڵاتێکی وەك ئەڵمانیا تەنها داهاتی لەشفرۆشی ٣٣ ملیار یۆرۆیە ساڵانەئەمە بۆئەوانەی کە بەشێوەیەکی ڕەسمی کارئەکەن ، بۆیە ئەو وڵاتانە

کە بەتەواوی داڕماون لەڕوی ئەخلاقی و دەرونی و کۆمەڵایەتیەوە هۆکارەکەی دابڕانیانە لەدینەکەیان بەشێوەیەکی گشتی چونکە ئەو دینەش تاڕادەیەك تەرکیز ئەکاتە سەر ئەخلاق و سیلەی ڕەحم و بابەتی لەم جۆرە بەڵام چونکە بەتەواوی عەلمانیەت زاڵبو بەسەر ئەو وڵاتانە دەبینی بەتەواوی شیرازەی ئەو وڵاتانە تێك چوو هەتا لە بواری ئابوریش تەواو تێك چووە سەیر مەکەن ئەو ئابوریەی کە لەپێش چاوتان دایە لەرۆژئاوادا ئابوریەکی بەهێزە وانیە بەلکو پێچەوانەکەی ڕاستە ووەلەبەردەم گەورەترین قەیرانی ئابوریدان بەهۆی زۆری قەرزی کەڵەکەبویان ،بۆنمونە لەئێستادا وڵاتی ئەڵمانیا ٢ ترلیۆن و ٣٠٠ ملیار یۆرۆ قەرزدارە ئەمە بێجگە لە ئەمریکا کە ٢٠ ترلیۆن قەرزدارە و یابانیش کە بە هەمان شێوە دینی عەلمانی بەسەری زاڵبوە و ١٢ تریلیۆن قەرزدارە بۆیە ئە بینی زۆرتیرین ڕێژەی خۆ کوشتن لەجیهاندا یابان بەپلە یەک ئەژمارئەکرێت کەساڵانە زیاتر لە٣٠هەزارکەس خۆی ئەکوژێت چونکە ئەوەندە مەشغوڵن بە ئیشو کارەوە هیچ ئاگایان لە لایەنی دەرونی وکۆمەڵایەتی و خێزانی نەماوە بۆیە پلەی یەکەمن لە ڕێژەی خۆکوشتن ، ئەمەش ئەو بەرهەمەیە کە ئەمرۆ لە کوردستان ئەبینین لە سەدا ٨٠ زیاتریش خەڵك دەنگیان بە عەلمانیەکان داوە کە دژایەتی شەریعەتی خوا دەکەن هەر چەندە دژایەتی بوونی خواش نەکەن . بۆیە ئەبینیت کاتێك یاسایەك دەرئەچێت لە کوردستانی خۆمان ئەبینین پێچەوانەی کلتورو ئاینی خۆمانە و دواتریش هەندێ جار دژی ئەوەستنەوە لەکاتێکدا خۆیان دەنگیان پێی داوە بۆنموونە لە یەکێك لە ساڵانی ڕابردو لە پەڕلەمانی کوردستان یاسای جەندەر دەرچوو کە ئەمە شەریعەتی دینی عەلمانیەتە کە ئاساییە پیاو لە پیاو مارە بکرێت و ژن لە ژن مارە بکرێت کە ئەمە بە ڕونی لە دینی عەلمانیەتدا هەیەو خەڵکیش دەنگیان پێداوە ، بۆیە کاتێك دەسەڵات دارەکان هاتن ویستیان ئەم یاسایە بێتە بواری جێبەجێکردنەوە خەڵکی لێی کردنە هەراو دەنگە دەنگ و وتیان چۆن ئەبێت پیاو لە پیاو مارە بکرێت و ژن لە ژن مارەبکرێت ئیتر دەسەڵاتداری کوردی سەری سوڕما چونکە دەڵێت ئەی مادام بۆچی تۆ دەنگت بە عەلمانی داوە و ناشزانی واتای چیە ئەی مادام تۆ بۆچی چەکت هەڵگرتوە بۆ دەسەڵاتێك کە ئەوە دینەکەی بێت وە تۆ دەنگت

داوه پێی و واتا ڕازیت بەوەی کە پیاو لە پیاو ماره بکرێت. جا ئەم بابەتە وەك ئەوە دێتە پێش چاوم کە کابرایەك گیرابوو حوکم درا بە عیدام و پێیان وت ئیعدام ئەکرێیت ئەویش وتی ئێباشە قەیچێکە وەکاتێك ڕۆژی جێبەجێکردنی هات و پەتەکەیان لەملی کرد ئەویش بە سەرسوڕمانەوە وتی ئەوەچیئەکەن ؟؟وتیان ئێ عیدامت ئەکەین و تۆزێ تر پەتەکەیان قایم کرد ، ئەویش وتی هێواش هێواش چەندجارێك کۆکیو وتی بابە خەریکە بخنکێم . ئەوانیش تەماشاین کرد و وتیان ئەمە واتای چیە ئەی ئیعدام مانای چیە لای تۆ؟؟، ئەویش وتی چوزانم خۆ ئێوە نەتان وت ئەتانکوژم خۆ خەریکە ئەم کوژن ئێوە . وتیان بابە عیدام واتا هەڵواسین ئەویش وتی ئەوە چیە من تێنەگەیشتومە !.ئەوانیش هێنایانە خوارەوە وتیان لەوانەیەئەم پیاوەشێت و بێعەقڵ بێت وەعیدامیش لەسەر کەسی شێت نیە بۆیە هەڵواسینەکەیان دواخست تابۆیان ڕون ئەبێتەوە تاخوائەمە شێتە یان نا .ئەم بابەتی دەنگدان و حیزبانەش وایە کاتێك خەڵك خۆی دەنگی پێیان داو دواتر جەندەر هاتە پێشەوە وتیان بابە ئەوە چی ئەکەن ئەمە لەگەڵ کلتوری ئێمە ناگونجێت و شەریعەتی ئیسلام قبوڵی ناکات ، ئەوانیش تەماشایان کرد وتیان هەر ئێوە خۆتان دەنگتان داوە بە ئێمە ئێمەش عەلمانین واتا کار بە حوکمی ئیسلام ناکەین ، بەڵام یاساکەیان هەڵپەسارد وەك کابرای بێعەقڵ هەتا ئەوکاتەی تێدەگەن ئەوخەڵکە کەعەلمانیەت مانای چیە . دەی کەواتە کاتێك ئێوە چەکتان بۆیان هەڵگرتوە و لەگەڵیانن و پشتیان ئەگرن ئەوە ئێوەن هەڵەن و تێنەگەیشتون و نازانن عەلمانیەت واتای چیە . هەروەك چۆن نازانن شەریعەتی خوای گەورە واتای چیە ، ئەم دووشتە جیاوازن و هەر یەك خاوەن شەریعەت و یاسای تایبەت بە خۆیانن . بۆیە تۆ ناتوانیت لە یەك کاتدا خاوەن هەردوکیان بیت ، واتا نابێت موسڵمانێکی عەلمانی بیت ، ئەوەی ئێوە ئەیکەن بەڕاستی شتێکە سەرتان لە خۆشتان شێواندوە و سەرتان  لە عەلمانیەکان و موسڵمانەکانیش شێواندوە . هاتون دەنگی پێئەدەن کەچی ڕێگەش نادەن کە یاساکانی جێبەجێبکرێ ، زۆرجار ئەبینین کە خەڵك گلەی ئەکات لەوەی فەساد زۆر بوە و بەدرەوشتی زیادی کردوەو کەناڵەعەلمانیەکان بەدرەوشتی بڵاو ئەکەنەوەو گەنج بەکەیف خۆی ئەچێتە نادی و سەنتەری مەساجەکان ئارەقیش ئەخۆن و

چەندین گلەی تر ئەکات لە کاتێکدا خۆی بەرپرسە لە بوونی هەموو ئەو فەسادوبەدرەوشتیەی نێو کۆمەڵگا و خۆی دەنگی پێداوە و چەکداریش بۆ ئەم یاسایانە ئەکات ، بۆیە کاتێك تۆ گلەیی ئەکەی لە دەسەڵات و خراپەکاریەکانی و فەسادیەکەی ئەوە تۆ خۆت بەرپرسی ئەزیزم بەو چەکەی کە لەشانتە ویان بەو ناسنامە حیزبیەی کە لە گیرفانتە و بەپشتیوانی و دەنگی تۆیە ئەمە ئەکات . وەئەگەر عەلمانیەکانی کوردستان لە هەموو شتێك درۆیان کردبێت ، لە کارەبا درۆیان کردبێت لە جادەو بان دزیان کردبێت لە نەوت دزیان کردبێت لە هەموو شتێك درۆ و کلاواتیان کردبێت لە عەلمانیەت بوندا درۆیان نەکردوە و زۆر زۆر ڕاستگۆ بونە بۆیە دەبینی ساڵ بە ساڵ هەوڵیش ئەدەن زیاتر عەلمانیەت زاڵ بکەن بەسەر شەریعەتی ئیسلام هەر بۆیە ئەبینیت مەلاکان ئەکوژن دەربەدەریان ئەکەن یان مەلا باشەکان دێنن ڕیشیان ئەسوتێنن و سوکایەتیان پێ ئەکەن لە زیندانەکاندا و دژایەتی میمبەرەکاریگەرەکان ئەکەن جا ئاگاداربن ئەم کارانە ئەکەن بەرامبەر ئەو مەلایانەی ڕاستگۆن لەگەڵ دینەکەیان وەکادری حیزبی نین چونکە مەلای حیزبی جیاوازە لەگەڵ ئەو مەلا ڕاستگۆ و ئەو مامۆستایانەی کە دەرکراون و میمبەرەکانیان لێسەندراوەتەوە ، بۆیە عەلمانی هەوڵ ئەدات ئەو مەلایانە بکاتە سەر میمبەر کە کادری خۆیانن . مامۆستا دەڵێت ( من لەم ماوەیە لە کوردستان بوم زیاتر لە ٣٠ پێش نوێژم بینی کە نوێژم کرد لە دوایان واللە تەنها چواریان الفاتحة یان تەواو بوو کە واجبە هەموو موسڵمانێك الفاتحة ی ڕەوان بێت نەك هەر پێش نوێژەکان کەچی واللە چواریان بەتەواوی توانیان بەجوانی بیخوێننەوە ) بۆیە ئەمانەیان کردۆتە پێشەوای خەڵکی تەنها کەمێك ئەگەر مابێتەوە ئەوانەشیان کردۆتە سەر هەزە کە بۆیان نیە قسەی حەق بکەن یان هەندێ بابەت ڕون بکەنەوە . گەر هەڵەنەبم لە ساڵی ٢٠٠٧ وەزارەتی ئەوقافی کوردستان تاقیکردنەوەیەکی بە مەلاکان کرد لە ئەنجامەکەی ڕاگەیەندرا کە لە سەدا ٨١ ی ساقیت بونە ، وە لە خوارەوە نوسرابوو ئەو مەلایانەی لە هەموو بابەتەکان کەوتون بۆیان هەیە لە خولی دووەم بەشداری بکەنەوە !جا میلەتێك ٩٠ ساڵبێت عەلمانیەتی تێدا بێت و سەرکردەکانیش عەلمانی بن و مەلاکانیشیان کادری ئەو حیزبانە بن ، ئەبێت ئەم خەڵکە چی لێدەرچێت لەکاتێکدا ئەوەندە

مەشغولن بە فیلم و تەلەفیزیۆن و ئەنتەرنێتەوە مەجالی ئەوەی نیە ١٠ خولەك گوێ لە ئامۆژگاریەك بێت کاتێکیش دەگەڕێتەوە لای خوای خۆی هەر ئەوەندەی پێ ئەکرێ بلێ والله ربنا ما کنا موشرکین واتا دەلێن ئێمە موشریك نەبوین ، لەکاتێکدا ئەم کردارو دەنگدان و حیزبایەتیەتان هەمووی شیرکە ، بۆیە ئەوەی لە ڕۆژ هەڵاتی ناوەڕاست و بەتایبەت لە کوردستان ڕو ئەدات لە جەردەیی و شەڕ و کوشتن و بڕین و دزیو تاڵانی ئەمە هەمووی بەرهەمی ئەو عەلمانیەتەیە کە نزیکەی ٩٠ ساڵە فەڕەنساو بەریتانیا بۆیان هێناوین و هەتا ئەمڕۆ ئەو دوو وڵاتەو وڵاتانی تریش پشتگیری ئەم دەسەڵات دارە عەلمانیانە ئەگرن بۆ ئەوەی زیاتر ئەم میلەتانە بچەوسێننەوە و وە جاهیل و نەفامیان بکەن و تەنها وەك سیمبولێك و ڕەمزێك چەند دەستەواژەیەکی ئاینی بەکاربێنن وەك (بسم الله الرحمن الرحیم ، الحمدالله ، إن شاءالله ، ماشاء الله) بەڵام لە کرداردا پێچەوانەی شەریعەتی خوای گەورە ئەجولێنەوە تبارك وتعالی ، بۆیە خوای گەورە سبحانە وتعالی ئەفەرمێت (وَمَا يُؤۡمِنُ أَكۡثَرُهُم بِٱللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشۡرِكُونَ)(یوسف ١٠٦)واتا : جا زۆربەی زۆری خەڵکی باوەڕناهێنن بە خوای تاك و تەنها، بێ ئەوەی هاوەڵی بۆ بڕیار نەدەن (بێگومان ئیمان و باوەڕی وا هیچ نرخی نیە و خوای گەورە لەو تاوانە خۆش نابێت). بۆیە زۆربەی خەڵکی شیرك ئەنجام ئەشەن و موشریکن وەك چۆن خوا ئەفەرمێت (وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ)(الأعراف١٨٧) واتا زۆربەی زۆری خەڵك نەزانن بەڵکو لە شوێنی تر ئەفەرمێت (وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ يَجۡهَلُونَ)(الأنعام١١١) واتا زۆر بەی زۆری خەڵکی جاهیلن ، بۆ؟ چوونکە نازانن (يَعۡلَمُونَ ظَٰهِرًا مِّنَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَهُمۡ عَنِ ٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ غَٰفِلُونَ)(الروم٧) واتا شتێك ئەزانن لە دونیا بەڵام بۆ ئاخیرەت تەواو خەڵکی غافیلە جاهیلە . وەك وتمان تەنها ئەو چەن دەستەواژەیە بەکاردێنن ئەگەرنا لە کردار و لە خۆشەویستیان ئەسڵەن بۆ سەر دینی ئیسلام نیە . بۆیە وەك وتم عەلمانیەت دوو بەشە بەشی یەکەم کۆمۆنیستە و کوفرێکی ئاشکرایەو ڕونە

بەشی دووەم غەیرە مولحیدیە و باوەڕی بە بونی خوا هەیە بەڵام باوەری بە شەریعەتی ئیسلام نیە وە ئەوەشی جێبەجێ ئەکرێت وردە وردە لە خەڵکی ئەسێننەوە جا بە چەند ساڵ توانی بەوەندە وەك مصطفى کمال اتاتورك کە توانی بە ١٠ ساڵ ئەمانە جێ بەجێ بکات ، جا ئەمە

ئەگەڕێتەوە بۆ ئازایەتی ئەو سەرکردە عەلمانیانیەی کە هەیە تا چەندتوانیوەیەتی شەریعەت لە ناو خەڵك دەربهێنێت وە چەن توانیویەتی دیموکڕاسی جێبەجێ بکات لە ناو خۆیان کە ئەڵێن ئەمە بەرهەمێکی زۆر باشە و دیموکڕاسی تاکە چارەسەرە بۆ کێشەکان وەك ئەوروپا بۆنموونە ئەڵمانیا " ئەوەی کە ئێمە کە وتینە دوای کەباب کەچی کاتێك گەیشتین دیتمان لە کەر داغکردن زیاترهیچی تر نەبوو " دەبینی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان هیچ نەماوە پەیوەندیە خێزانیەکان هیچ نەماوە وە إقتصادیان لەسەر زەرەرو قەرز بونیاد ناوە وە ئەڵمانیا بە نموونە ٣٨٠ساڵی داهاتوی خۆی خواردوە واتا دە جیلی لەدایك نەبوو بەشی خوراوە واتا لە پەنجاوە کە دەستوری ئەڵمانیا نوسراوە هەتا ئێستا ئەو جیلەی کەلەدوای جەنگی جیهانی دوەمدا هاتوە ٣٨٠ ساڵی داهاتوی خۆی خواردوە وە دە جیلی لەدایك نەبووش حەقی خوراوە لە لایەن ئەو خەڵکانەی کە ئێستا لەسەر زەوین بۆ ؟

چونکە ئەم خەڵکە عەلمانیەحیساب بۆ قیامەتی ناکات حیساب بۆ ئەو سەردەمەی خۆی ئەکات کە تێیدا ئەژی بۆیە ئیمان دار ئەترسێت لەوەی چی بەجێ جێشتوە چی لەسەردەمی خۆیا ڕەوان کردوە بۆیە کاتێك ئەم ئایەتانە ئەبینیت کە خوای گەورە ئەفەرمێت (يُنَبَّؤُا۟ ٱلْإِنسَٰنُ يَوْمَئِذٍۭ بِمَا قَدَّمَ وَأَخَّرَ)(القیامة١٣) واتا لە قیامەت لێیان ئەپرسرێت کە چیمان بۆ خۆمان جێهێشتوە و لە سەرەتاشەوە چیمان کردوە ، ئەمە زەنگێکی مەترسی دارە بۆیە ئینسانی ئیماندار هەرگیز شتێکی وا ناکات کە بەزیان بشکێتەوە بۆی ،بەڵام عەلمانیەت ئەم شتەی نیە بۆیە دزی ئەکات درۆ ئەکات تاڵانی ئەکات خەڵك ئەکوژێت وە ئەمە ئەنجامی عەلمانیەکانە بۆیە لاتان سەیر نەبێت کاتێك ئەبیستن ئەوترێ فڵانە سەرکردە ئەوەندە پارەیەی دزی و فڵانە سەرکردە خەڵکی کوشت چوونکە ئەمە ئەسڵی خۆیانە . من کە لەخوا نەترسم بۆ ناکوژم بۆ نادزم بۆ نابڕم ئەم خەڵکانەش عەلمانینە بۆیە هیچ حیساب بۆ قیامەتی خۆیان ناکان حەقی خۆشیانە بۆ؟ چوونکە عەلمانیە ،

لەوانەپرۆفیسۆر ( هانزە زین )کە ئەڵمانە باسی لەوە کردوە کە ئەم دەسەڵاتدارانەی کەلەدوای جەنگی جیهانی دوەمدا هاتون قەرزیان کردوە لەسەر نەوەی لە دایك نەبوو جا ئەڵێت

کێشەی ئێمە ئەوەیە لە دەستوری ئەڵمانیدا یاسایەکمان نیە ڕێگری بکات لەو سەرکردانەی دێنە سەر حوکم قەرز نەکەن . بۆیە ئەبینی قەرز ئەکەن بە ڕیباوە بۆیە دەسەڵاتداری کوردیش بەهەمان شێوە وڵاتیان توشی قەرزداری کردوە وە ڕیباشی ئەچێتە سەرێ وە نەوەی لەدایك نەبوش توشی قەرز ئەبێت وە ئەوەشی لەسەر حوکمە ماندو ئەبێت بە بەرزکردنەوەی ڕوسومات و باج و نرخەکانەوە ، جائەگەر کێشەی ئابوریان هەبێت کێشەی سنورمان هەبێت کێشەی ناوخۆیان هەبێت کێشەی خێزانیان هەبێت کێشەی دەرونیان هەبێت هەرهەمووی بەرهەمی عەلمانیەتە.

باوەڕبکەن بەڕێزانم عەلمانیەکان لەم کارانەیاندا هیچ درۆیان نەکردوەو ئەمەش بەرهەمەکەیەتی جا تۆ تێگەیشتوی تێنەگەیشتوی کێشەی خۆتە وە ئەم کێشانەی هەیە ئەنجامی دەنگدان و چەکهەڵگرتنەکانی خۆتانن، چۆن لە دونیا لێی بێزاری گومانیشت لەوەدا نەبێت بەگوێرەی ئەوەی ئێمە لە شەرع خوێندومانە لە قیامەتیش لێی ڕائەکەی لە کاتێکدا خۆت بوی بە هۆکاری ئەوەی ئەوان دەسەڵات بگرنە دەس وەك پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم ئەفەرمێت هەموو زاڵمێك لەگەڵ شوێنکەوتوانای پێکەوە لە ناو ئاگردان . بۆیە یاساو شەریعەتی ئیسلام دیارە وە نەتیجەکەشی دیارە لەهەمان کاتدا عەلمانیەت شەریعەت و یاسای خۆی جیاوازە وە نەتیجەکشی دیارە

